# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحيم

## اللهُمَّ صَلِّ على سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ الوَصــفِ وَالوَحْيِ وَالرِّسَالَةِ وَالحِكْمَةِ وَعَلى آلِهِ وَصَحـبِهِ وَسَلِّمْ تَسليماً

**ئەم دیـوانە بـریتیە لە کۆمەڵێـک لە شـیعرەکانی حەزرەتـی شـێخ ئەبـوبەکری شـیبلی کە هاوسەردەمی شێخ مەنصوری حەلاج بووە ، کەسێکی خوداناس و ئەویندار بوخودا بووە ، هەر بۆیە لە شیعرەکانیدا بەرجەستە دەبێت کە زۆرترین ئاماژە بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بۆ ئەوینداریێتی خودا دەکات و جارێک بە "ئەو" و جارێک بە "لەیلا" و جارێک بە "دڵ" ئاماژەی بۆ داکات ، شیعرەکانی شێخی شیبلی ڕەنگدانەوەیەکی خوداناسی زۆر قووڵە کە هەر دێڕێکی مرۆڤ دەتوانێت چەندین واتا و مەبەستی جوانی لێ دروست بکات کە هاوکاری بێت لە ڕێگەی گەیشتن بە خودا و ئەویندابوون بە حەزرەتی دۆست**

**هەژیر**

## پوختەیەک لە ژیاننامەی شێخ ئەبوبەکری شیبلی

مەســــت و مەردی دیـــــوانی ئەوینــــــداران ، خودانــــــاس و پیاوچـــــاکی گەورە حەزرەتـــی شـــێخ ئەبـــوبەکری شـــیبلی ، ئەبـــوبەکر دلــف کـــوڕی حجــدر ، یـــاخود جەعــــفەری شــــیبلیە ، لە ســــاڵی ٢٤٧ کـــۆچی لەدایکبـــووە ، لە بنەڕەتــــدا خۆراســــانیە و لە بەغـــداد لەدایکبـــووە و مـــاوەتەوە ، لە کتێــــبە مێژوویەکانــــدا وتــــراوە کەوا لە ســــامەڕا لەدایکبووبێـــــت ، هاوســــەردەمی زانـــــای گەورەی تەریقەتـــی ســـۆفیگەری حەزرەتـــی شـــێخ جونەیـــدی بەغـــدادی بـــووە ، شـــێخی شـــیبلی یەکەم کەســـە زانســـتی ســـۆفیگەری بە زانســـتی خەرقەپۆشـــی یـــان بەرگپۆشـــی یـــان خوداناســـی ناوبێنێـــت و لە بەرامـــبەر زانســـتی کـــاغەزی (واتـــا فیقهـــو زانســـتە ڕووکەشـــیان) دابنێـــت ، هەروەهـــا هاوســـەردەمی شـــێخ مەنصـــوری حەلاج بـــووە و زۆر لە خوداناســـیدا ســـودمەند بـــووە لێـــی ، شـــێخ جونەیـــدی بەغـــــدادی دەرحەق بە شـــێخ ئەبـــوبەکری شـــیبلی فەرمـــوویەتی : (هەمـــوو کەلێـــک تـــاجێکی هەیە ، تـــاجی ئەم کەلەش شـــیبلیە کە لە کـــوڵاوی زانســـتی خـــواردۆتەوە) ، دەگێـــڕنەوە کە شـــێخی شـــیبلی ئەوەنـــدە خوداپەرســـتی دەکـــرد کە وای لێهـــاتوو شـــەوان چـــاوی بە خوێیـــاو دەشـــۆرد تـــاکو بەخەبەر بمێنێـــتەوە هەتـــا بەیـــانی ، لە ســـاڵی ٣٣٤ کـــۆچی لە تەمەنـــی ٨٧ ســـاڵیدا لە دونیـــادا

جەستەی بەجێما و ڕووحی پیرۆزی چووە خزمەت ئەوینداره‌کەی کە حەزرەتی دۆستە کە زاتی خودایە ، گۆڕی پیرۆزی دەکەوێتە پشت مزگەوتی حەزرەتی ئیمام ئەبو حەنیفەی نیعمان (ئیمامی ئەعظەم) ، تەریقەتی قادری کە دەگەڕێتەوە بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی لەویشەوە مۆڵەتەکە دەست بە دەست دەکاتە شێخ ئەبوبەکری شیبلی کە لە شێخ جونەیدی بەغدادی وەرگرتووە و ئەویش لە شێخ سڕی سقطی خاڵی وەریگرتووە .

## شیعری یەکەم : یحبک قلبي ما حییت فإن أمت

يُحِبُّكَ قلبي ما حَييتُ فإن أمُت

يُحِبُّكَ عَظمٌ في التراب رميم

**دڵم خۆشی دەوێیت هەتا لە ژیاندا بم ، خۆ ئەگەر مردم ئەوکات ئێسک و پروسکێک تۆی خۆش دەوێت کە بە خاک و خۆڵ سپێردراوە**

### شیعری دووەم : والهجر لو سكن الجنان تحولت

والهجرُ لو سكن الجِنان تحولَّت

نِعَمُ الجِنانِ على العبيد جحيما

والوصلُ لو سكن الجحيمَ تحولّت

نارُ الجحيم على العبيدِ نعيما

**ئەگەر بەجێهێشتن لەناو بەهەشتیش هەبێت ، ئەوا خۆشیەكانی بەهەشت دەكاتە دۆزەخ ، گەیشتن بە حەزرەتی یار {واتا خودا} ئەگەر لە دۆزەخیش بێت ئەوا ئاگری دۆزەخ بۆ بەندەكان دەكات بە خۆشگوزەرانی**

## شیعری سێهەم : ذاب مما في فؤادي بدني

ذاب مما في فؤادي بَدَني

وفؤادي ذاب مما في البدن

فاقطعوا حبلي وإن شئتم صِلُوا

كلُّ شيءٍ منكم عندي حَسَنٌ

صح عند الناس أنّي عاشق

غير أن لم يعلموا عِشقي لِمَن

**جەستەم ئەوەی توانەدەوە کە لەناو دڵمدایە و دڵیشم ئەوەی توانەدەوە کە لەناو جەستەمدایە ، ئەگەر دەتانەوێ پەتی گەیشتن پێتانم لێ ببڕن ئەگەرنا بمگەیەنن ، هەموو شتێک لە ئێوەوە چاک و جوانە بۆ من ، ڕاستە خەڵک دەزانن من ئەویندارم ، بەڵام نەیانزانیوە ئەوینداری کێم؟**

## شیعری چوارەم : تغنی العود فاشتقنا

تغنَّى العودُ فاشتَقنا

إِلى الأحباب إِذ غَنَّى

وكُنّا حيثُما كانوا

وكانوا حيثما كُنَا

**عـود دەنـگ و ئـاوازی خـۆی بەدەرخسـت و ئـێمەش پەرۆشـبووین بـۆ دیـدارێک ، بـۆ خۆشەویسـتانمان کـاتێ سـرودیان دەچـڕی ، ئـێمە لەو شـوێنەین کە ئەوانـی لێبـوون ، ئەوانیش لە شوێنێک بوون کە ئێمەی لێ بووین**

## شیعری پێنجەم : أحب قلبي و ما درى بدني

أحَبَّ قلبي وما درى بدني

ولو درى ما أقام في السِمَنِ

**دڵـم ئەوی خـۆش ویسـت و جەسـتە بـێ ئاگـا بـوو ، خـۆ ئەگەر ئاگـادار بـووایە ئاوهـا قەڵەو نەدەبوو**

## شیعری شەشەم : ذكرتک لا إني نسيتک لمحة

ذكرتك لا أنّي نسِيتُكَ لمحةً

وأيسَرُ مافي الذكرِ ذكرُ لساني

وكِدتُ بلا وَجدٍ أموتُ من الهوى

وهام عليَّ القلبُ بالخفقانِ

فلما أراني الوجدُ أنَّكَ حاضري

شَهِدتُكَ موجوداً بكل مكانِ

فخاطبتُ موجوداً بغير تكلم

ولاحظت معلوما بغيرِ عيانِ

یادی تۆم کرد نەک لەبەر ئەوەی بۆ ساتێک لەیادتم کردبێ ، ئاسانترین شتیش خۆ لە یادکردندا یادکردنە بە زمان ، خەریکبوو لە تاو ئەویندارى و بێ خەمیدا بمرم ، دڵم دەستی کرد بە لێدانی توند ، کاتێک لە خەمباری خۆمدا تێکەیشتم کە تۆ ئامادەیت

**، بینـــیم بوونـــت هەیە لە هەمـــوو شـــوێنێک ، بـــۆیە دەســـتم کـــرد بە گفتوگـــۆ لەگەڵ هەبوویەک بەبێ قسەکردن و تێبینی زاتێکی زانراو و دیارم کرد بەبێ بینین بە چاو**

## شیعری حەوتەم : كما ترى حيرني

كما ترى حَيَّرني

شرَّدني عن وطني

إذا تغيبتُ بدا

وإن بدا غيَّبَني

**وەک دەبینیـــت سەرســـامی کـــردووم ، لە شـــار و وڵات دەربەدەری کـــردووم ، کە مـــن بڕۆم ئەو دەرئەکەوێت ، کە دەریش بکەوێت من ون و نادیار دەکات**

## شیعری هەشتەم : إن المحبة للرحمن تسكرني

إنَّ المحبة للرحمنُ تسكِرُني

وهل رأيتَ محباً غير سكرانِ

**ئەویندارى خودا من مەست دەكات ، ئایا تا ئێستا ئەویندارێكت دیوە كە مەست نەبێت ؟**

## شیعری نۆیەم : یا منیة المتمني

یا منیة المتمني

شغلتني بك عني

عجبت منك ومنّي

ئەی ئــاواتی ئــاواتخوازان ، وەهــا منــت ســەرقاڵکردووە بە خــۆتەوە کە خــۆم لەیــاد کردووە ، بەمەش سەرسام و سەرسوڕماو بوومە لە خۆم و لە خۆت

### شیعری دەیەم : غبت عني فما أحس بنفسي

غبت عني فما أُحِسُ بنفسي

وتلاشت صِفاتِيَ الموصوفه

فأنا اليوم غائب عن جميعِ

ليس إلاّ العبارة الملهوفه

**وەها لە مـن ونبوویـت کە وام لێهـاتووە هەسـت بە خـۆم نـاکەم ، هەمـوو ئاکـار و شـتێک کە منـی پـێ وەسف بکـرێم نەماوە ، ئێسـتا مـن لە هەمـووان ونـم ، ئەوەی مـاوەتەوە تەنهـا دەربڕینێکی خەمگینانەیە**

## شیعری یانزدەهەم : علم التصوف علم لا نفاد له

عِلمُ التَصوُّفِ عِلمٌ لا نفادَ له

عِلمٌ سنيٌ سماويٌ رُبوبيُّ

فيه الفوائد للألبابِ يعرفها

أهلُ الجزالةِ والصنعُ الخصوصيُّ

**زانستی تەسەوف (خودناسی و خواناسی) زانستێکە کە تەواوبوونی بۆ نییە ، زانستێکی خاوێن و جوانی ئاسمانی و خوداییە ، سودی زۆری هەیە بۆ ئەوانەی نرخ و بەهای دەزانن ، ئەو کەسانە دەبنە خاوەنی پێگە لای خودا چونکە حەز و ئارەزووەکانیان دادەمرکێنن و ڕوودەکەنە خودا**

## شیعری دوانزدەهەم : أظلت علینا الیوم منک غمامة

أظلّت علينا اليوم منك غمامةٌ

أضاءت لنا برقاً وأبطَا رَشاشها

فلا غيمُها يجلو فيأيسُ طامعٌ

ولا غيثُها يأتي فَيَروَى عِطاشُها

**ئەمڕۆ هەورێـک هـات بەسـەرماندا و بـوو بە سـێبەر ، بروسـکەکانی ڕۆشـنایی پیشـان دایـن و بە هێواشــی دابــاری ، نە هەورەکەی لادەچــوو تــا کەســێکی چــاوچنۆک بێهیــوا بێــت ، بەش بارانەکە داباری بۆ ئەوەی تینوێتی بشکێنێت**

## شیعری سیانزدەهەم : وكذبت طرفي فيک و الطرف صادق

وكَذَّبتُ طَرفي فيك والطرفُ صادق

وأسمعت أُذني منك ما ليس تسمعُ

ولم أسكنِ الأرض التي تسكنونها

لئلا يقولوا إنني بِكَ مولعُ

فلا كبدي تهدأ ولا لك رحمةٌ

ولا عنك إقصاء ولا فيك مطمعُ

**لەکـاتی چاوتروکانـدا ئەگەرچـی ڕاسـتگۆ بـوو بەڵام کاتێـک دەیـوت دۆسـتم بینیـوە مـن بە درۆم دەخسـتەوە ، کوێکـانم لە تـۆوە شـتانێکی بیسـت کە نەدەبیسـترا ، نیشـتەجێ نەبـووم لەو خـاکەی ئێـوەی تێـدا بـوون نەوەک بڵـێن کە بە تـۆ پەیوەسـتم ، نە جەرگـم ئـارامی بـۆ هـات و نەش تـۆ بەزەییەکـت نوانـد ، نە دەتـوانم لێـت دوور بـکەومەوە و نەش دەتـوانم داوات بکەم**

## شیعری چواردەهەم : أروح وقد ختمت على فؤادي

أروح وقد ختمتَ على فؤادي

بحبك أن يَحِلَّ به سِواكا

فلو أني استطعتُ غَمَضتُ طَرفي

فلم أنظر به حتى أراكا

وفي الأحباب مختص بوَجدٍ

وآخر يدّعي معه اشتراكا

إذا انسكبت دموع في خدودٍ

تَبَيَّنَ من بكى ممن تباكى

**دەڕۆم ئەگەرچـی مـۆرت داوە لەسـەر دڵـم بە خۆشەویسـتیت کە جـگە لە تـۆ کەسـی تـری تیا نەبێ ، ئەگەر لەتوانـام هەبوایە چاوەکـانم دادەخسـت و سـەیری کەسم نەدەکـرد هەتـا تـۆ نەبیـنم ، لە خۆشەویسـتان و ئەویـنـداران هەیە لە دووری تـۆ تەنهـا خەم و خەفەتـی هەیە و هەیە بـانگەوازی ئەوە دەکـات کە پێـت کەیشـتووە و لە دوانـدنت بەشـدارە ،**

**ئەگەر فرمێســک ڕژا بەســەر ڕوومەتەکــان ، دەردەکەوێــت کە کــێ بەڕاســتی دەگــری و کێیش بە درۆ وەها خۆی دەردەخات کە دەگری**

## شیعری پانزدەهەم : لیس عید المحب قصد المصلى

لیس عیدُ المحب قصدَ المصَلَّى

وانتظارَ الجیوش والأعوانِ

إنما العید أن تکون لدى الحِب

بِ کریماً مقرَّباً في الأمانِ

**جەژنـی ئەوینـداران بریتـی نیـیە لە چـوون بـۆ مـزگەوت یـاخود چـاوەڕوانکردنی لەشـکر و هاوکاران ، بەڵکو جەژن ئەوەیە لەلای ئەویندارەکەت بەڕێز و نزیک و پارێزراو بیت**

## شیعری شانزدەهەم : نسيت اليوم من عشقي صلاتي

نَسِيتُ اليوم من عشقي صلاتي

فلا أدري غداتي من عِشائي

فذكرك سيدي أكلي وشُربي

ووجهك إن رأيتُ شِفاءُ دائي

**ئەمڕۆ لە تاو ئەوینداریەکەم نوێژەکەم لەیاد کرد ، نەمزانی نوێژی بەیانیە یان ئێوارە ، گەورەم یادی تۆ خواردن و خواردنەوەمە ، ڕووخساری تۆ کە ببینم چارەسەرە بۆ نەخۆشی و گرفتاریەکەم**

## شیعری حەڤدەهەم : عودوني الوصال و الوصل عذب

عوَّدوني الوصال والوصل عذب

ورموني بالصد والصد صعبُ

زعموا حين عاتبوا أن ذنبي

فرط حبي لهم وما ذاك ذنبُ

لا وحسنِ الخضوع عند التلاقي

ما جَزا من يُحِبُّ الاّ يُحَبُّ

**بەڵێنـــی دووبـــارە بەیەکگەیشـــتنیان پێـــدام و ئەم بەیەکگەیشـــتنەش لەلای مـــن شـــیرینە ، دواتـر تـۆمەتی دابـڕان و دوورەپەرێزیـان دایە پـاڵم لەکاتێکـدا دابـڕان قورسـە ، کاتێـک لۆمەیـان کـردم وایـان نیشـاندا کە تـاوانی مـن زیـادەڕۆییە لە خۆشەویسـتی ئەوانـدا ئەگەرچـی ئەوە تـاوان نیـیە نەخێـر ، خۆسـپاردن و کـوێڕایەڵیش ئەو کـاتەیە کە دیـدار ڕوودەدات ، پاداشتی ئەو خۆشویستەرە ئەوەیە کە خۆشبویسترێتەوە**

## شیعری هەژدەهەم : خيالک في عيني و ذکرک في فمي

خَيالُكَ في عيني وذِكرُكَ في فمي

ومثواك في قلبي فأين تغيب

**خەياڵـت وا لەنـاو چاوەكـانمە و يـادت لەسـەر زووبـانە ، شـوێنت لەنـاو دڵـمە ئيتـر لەكـوێ دیارنامێنیت ؟**

## شیعری نۆزدەهەم :  رآني فأوراني عجائب لطفه

رآني فأوراني عجائب لطفه

فَهِمتُ وقلبي بالفراق يذوبُ

فلا غائب عني فأسلو بذكرهِ

ولا هو عني مُعرِض فأغيبُ

**ڕوانـیە مـن و بەمەش سەیروسـەمەرەی بەخشـندەییەکانی خـۆی نیشـانم دا ، تێگەیشـتم و دڵـم بە دووری ئەو دەتـوێتەوە ، نە دیـار نەمـا تـاکو یـادی نەکەم ، نەش ڕووی لـێم وەرگێڕا تا منیش دیار نەمێنم**

## شیعری بیستەم :  على بعدک لا یصبر من عادته القرب

على بُعدك لا يصبرُ من عادَتُه القُربُ

ولا يقوى على هجرك من تيّمَهُ الحب

فمهلا أيها الساقي فقد أسكرني الشرب

فإن لم ترك العينُ فقد يُبصِرُك القلب

لە دوای دووری تـۆ ئـارام ناگرێـت ئەوەی بە نزیکـی لێـتەوە ڕاهـاتووە ، هەرکەسـیش ئەوینـدارت بێـت بەرگەی دوورکەوتـنەوە لێـت ناگرێـت ، ئەی سـاقی (مەی تـێکەر) لەسـەرخۆ مەی تێـبکە چـونکە مەسـتی کـردم ، خـۆ ئەگەر چـاو نەتبینێـت ئەوا دڵ دەتبینێت

## شیعری بیست و یەک :  لیس مني إلیک قلب معنی

**لیس مني إليك قلب مُعَنّى**

**كُلُّ عضو مني إليك قلوب**

**تەنها دڵێکم نییە کە سەرقاڵ بێت بە تۆوە ، هەموو ئەندامەکانی من بۆ تۆ دڵن**

## شیعری بیست و دوو :  من لم یکن للوصال أهلا

من لم يكن للوصال أهلاً

فكل إحسانِهِ ذنوب

ئەوەی شایەنی گەیشتن بە دیداری خودا نەبێت ، ئەوا هەموو چاکەیەکی بۆی تاوانە

## شیعری بیست و سێ : من أين لي أين و إني كما ترى

من أين لي أين وإنّي كما ترى

أعيش بلا قلب وأسمى بلا قصد

**جا ئیتر من لەکوێ شوێنێکم بۆ هەبێت لەکاتێکدا وەک دەبینیت ، دەژیم بەبێ دڵ و ناوێکی بێ مەبەستم هەیە**

## شیعری بیست و چوار : و أعجب شيء سمعنا به

وأعَجبُ شيءٍ سَمِعنا به

مريضٌ يُعادُ فلا يوجدُ

سـەیرترین شـتێک کە بیسـتبێمان بریتـی بـووە لە نەخـۆش کە کاتێـک سـەردانی بکرێـت دەبینرێـت نەخـۆش نییە {لێـرە شـێخی شبلی پشـت بەو فەرمـوودە قودسیە دەبەستێت کە دەفەرموێـت : (ئەی بەنـدەکەم نەخـۆش کەوتـم بـۆ سـەردانت نەکـردم ، وتیـان ئایـا تـۆ نەخـۆش دەکەویـت ؟ فەرمـووی : بەنـدەیەک لە بەنـدەکانم نەخـۆش کەوتبـوو ئەگەر سـەردانی ئەو بکەیـت منـی لەلا دەبینیـت) ، لێـرە لەم شـیعرەدا ئەکـرێ شـێخی شـیبلی یەکێـک لەم دوو مەبەسـتەی هەبێـت : یەکەم : مەبەسـتی ئەوەیە کە کاتێـک چـووە بـۆلای نەخۆشـەکە دەبینێـت بەهـۆی ئەم سـەردانەوە نەخۆشـیەکە نەمـاوە ئەمەش ئەکـرێ ئامـاژەیەک بێـت بـۆ ئەوەی کە حەزرەتـی دۆسـت کە خـودایە ئەگەر کەسـێک یـاد بکـاتەوە نەخۆشـی و ناخۆشـیەکەی لادەبـات ، دووەم : مەبەسـتی ئەوەیە کە کاتێـک سەردانی نەخۆشەکەم کرد ویستم خودا لەوێ بدینم بەڵام نەمدیت}

## شیعری بیست و پێنج : إذا ما کنت لي عیدا

إذا ما كنت لي عيدا

فما أصنع بالعيدِ

جرى حُبّك في قلبي

كجَريِ الماءِ في العُود

ئەگەر تۆ بۆ من ببیت بە جەژن ، ئیتر چیم داوە لە جەژن ، خۆشەویستی تۆ لە دڵمدا دێت و دەڕوات ، وەک تێپەڕبوونی ئاو لەناو قەدی درەختەکاندا

## شیعری بیست و شەش : وإنی و إیاه لفي الحب صادق

وإني وإياه لفي الحب صادق

نموتُ بما نهوى جميعاً ولا نُبدي

مـــن و ئەو لە خۆشەویســـتیەکی ڕاســـتگۆییانەداین ، دەمـــرین بەوەی خۆشـــمان دەوێـــت هەموومان و دەری نابڕین

## شیعری بیست و حەوت : ألیس من السعادة أن داري

ألیس من السعادةِ أنّ داري

مجاورة لدارك في البلادِ

**ئایا جێگای دڵخۆشی نییە ؟ کەوا ماڵی من لە تەنیشت ماڵی تۆوەیە لەناو شار و وڵاتدا ! (لێرەدا حەزرەتی شیبلی مەبەستی ئەوەیە کە دڵخۆشی دەردەبڕێت بەوەی ماڵی ئەو لە تەنیشت ماڵی خودایە)**

## شیعری بیست و هەشت : باح مجنون عامر بهواه

باح مجنونُ عامرٍ بهواه

وكتمت الهوى فَفُزتُ بوجدي

وإذا كان في القيامةِ نودي

أينَ أهلُ الهوى تقدَّمتُ وحدي

**مەجنـونی بنەمـاڵەی عـامر حەز و ئـارەزوو و ئەویـنەکەی خـۆی درکانـد ، منـیش حەز و ئـارەزوو و ئەویـنەکەم شـاردەوە بەمەش سـەرفرازبووم و بـردمەوە ، خـۆ ئەگەر لە ڕۆژی دواییـــدا بـــانگەواز بکرێـــت و بوترێـــت : کـــوان ئەوانەی حەز و ئارەزوویـــان هەبـــووە ؟ کـــوان ئەوینـــداران ؟ ئەوا مـــن بەتەنهـــا دەچـــمە پێشـــەوە (لێرەشـــدا شـــیبلی مەبەســـتی ئەوەیە کە ئەوەی کێبڕکێـــی ئەمـــی دەکـــرد لە ئەوینـــداری تەنهـــا مەجنـــون بـــوو کە ئەوینـــداری لەیـلا بـوو ، بەڵام مەجنـون خۆشەویسـتیەکەی بـۆ لەیـلا درکانـد ، هەر بـۆیە شـیبلی خۆشەویسـتیەکەی بـۆ خـودا نەدرکانـد تـاکو لە ڕۆژی دوایـی بڵـێ مـن ئەوینـداری ڕاســـتەقینەم کە ســـەرەڕای ئەو خۆشەویســـتیە زۆرەم بـــۆ خـــودا بەڵام شـــاردمەوە و نەمدرکاند)**

## شیعری بیست و نۆ : عیدي مقیم و عید الناس منصرف

عيدي مُقيم وعيد الناس منصرِف

والقلب مني عن اللذات منحرف

ولي قرينان مالي منهما خَلَفٌ

طُولُ الحميمِ وعينٌ دمعها يَكِف

**جەژنــی مــن دەمێنێــتەوە و جەژنــی خەڵــک ســاتێکە و دەڕوات ، دڵــم لە حەز و چێژەکــان لایــداوە ، دوو شــتیش هەیە کە هاویــارمن و نــاتوانم لێیــان دابــڕێم ، ئەوینداریەکی درێژکێش و چاوێکی پڕ لە فرمێسک**

## شیعری سی : تمنیت نارا أستضي بضوئها

تَمنَّيتُ ناراً أستضيُ بضَوئِها

فلمّا أضاءَت أحرقَتني شُعاعُها

داوای ئـاگرێکم کـرد کە ڕووناکم بکـاتەوە بە ڕۆشـناییەکەی ، کاتێـک ڕووناک بـووەوە تیشـکەکانی سـوتاندمی (لێـرەدا حەزرەتـی شـیبلی ئاماژە دەکـات بـۆ ئەوەی کەوا کاتێـک سـەرەتا داوای ئەوینـداربوونی خـودای کـردووە وایزانیـوە شـتێکی ئاسـانە بەڵام دواتـر بـۆی دەرکەوتـووە کە ئەم ئەوینـداریە بـونەوەران ئەسـوتێنێ ئەوەنـدە قـورس و زەحـمەتە ، دەکرێـت ئامـاژە بێـت بـۆ ئەو فەرمـوودە قودسـیەی (ئەگەر بەنـدەکەم بسـتێک لە مـن نزیـک ببێـتەوە ئەوا مـن مەترێـک {بە پێـوەری سـەردەمی ئـێمە} لێـی نزیـک دەبـمەوە) ئەمەش واتـا حەزرەتـی شـیبلی کاتێـک داوای ئەوینـداریەکی کەمـی خـودای کـردووە بەڵام خودا زۆر زیاتر ئەوینی بەسەر ڕشتووە لەوەی ئەو داوای کردووە

## شیعری سی و یەک : لتحشرن عظامي بعد إذ بليت

لتُحشَرَنَّ عِظامي بعد إذ بَلِيَت

يوم الحساب وفيها حُبكُم عَلِقُ

**لە ڕۆژی دواییـدا کاتێـک ئێسـک و پروسـکم کـۆدەکەنەوە دوای ئەوەی مـردم ، دەبیـنن لەناویدا خۆشەویستی ئێوەی تێدا جێگیر بووە**

## شیعری سی و دوو : ولو قلت طأ في النار بادرت نحوها

ولو قلت طَأ في النار بادرتُ نحوهَا

سُروراً لأني قد خَطَرتُ ببالكا

**خـۆ ئەگەر بڵێیـت بـڕۆ نـاو ئـاگر ئەوە بە دڵخۆشـییەوە دەڕۆمە نـاوی ، مـادەم بەیـادت هاتووم وا داوات لە من کردووە**

## شیعری سی و سێ : اسائل عن لیلی فهل من مخبر

أسائل عن ليلى فهل من مخبر

يكون له علم بها كيف تنزِل

پرسیار دەربارەی لەیلا دەکەم {لێرەدا لەیلا لە دەستەواژەی ئەهلی تەسەوف و عیرفان ئامازەیە بۆ خودا} ئایا کەس هەیە هەواڵم بداتێ ، یاخود ئاگاداربێت کە ئەو چۆن دەردەچێت و دەردەکەوێت ؟

## شیعری سی و چوار : وشغلت عن فهم الحديث سوى

وشُغِلتُ عن فَهمِ الحديثِ سوى

ما كان منكَ وحبُّكم شُغلي

وأديم نحو محدثي نظري

أن قد فَهِمتُ وعندكم عقلي

ســـــەرقاڵبوومە بەوەی لە گفتوگۆکـــــان تێـــــبگەم جـــــگە لەوەی لە تـــــۆوە دێـــــت و ئەوینـــداربوونی تـــۆ پیشـــەی مـــنە ، کاتێـــک لەگەڵ کەسـێک گفتوگـۆ دەکەم وەهـا خـۆم دەردەخەم کە لێی تێگەیشتووم ، لەکاتێکدا هزر و هۆشم هەمووی لەلای ئێوەیە

## شیعری سی و پێنج : ویقبح من سواک الفعل عندي

ويقبحُ من سواك الفعل عندي

فتفعله فيحُسنُ منك ذاك

**جـگه له تـۆ هەرکەسـێک کارێـک بکـات لەلام ناشـرین و نـابەجێیه ، بەڵام هەر که تـۆ کردت ئەوا لەلام جوان دەبێت ئەو کاره**

## شیعری سی و شەش : قد تخللت مسلک الروح مني

قد تخلَّلتَ مسلكَ الروح مِنّي

ولذا سُمِّيَ الخليلُ خليلا

فإذا ما نطقتُ كنتَ حديثي

وإذا ما سكتُّ كنتَ غليلا

**هـاتیته نـاو ڕێـڕەوی ڕووحـم ، هەربـۆیه حەزرەتـی ئیبـراهیم بە خەلیـل ناسـراوە چـونکه خـودا چـووەته ڕێـڕەوی ڕووحـیەوە ، ئەگەر مـن هەرچـی بڵـێم ئەوا هەر باسـی تـۆیه ، ئەگەریش بێدەنگ ببم تینوو دەبم بۆت**

## شیعری سی و حەوت : الحمد لله على أنني

الحمد لله على أنَّني

كضفدع تسكن في اليم

إن هي فاهت ملأت فمها

أو سكتت ماتت من الغم

سوپاس بۆ خودا کە من وەک بۆقێکم کە لەناو ئاو بژیم ، ئەگەر ئەو بۆقە دەم بکاتەوە لەناو ئاوەکە دەمی پڕ دەبێت لە ئاو ، خۆ ئەگەر بێدەنگیش بێت ئەوا لە داخ و خەمدا دەمرێت

## شیعری سی و هەشت : لست من جملة المحبين إن لم

لستُ من جملةِ المحبين إن لم

أجعلِ القلبَ بيتَه والمَقاما

وطوافي إخالُهُ السيرَ فيه

وهو رُكني إذا أردتُ استلاما

**لە ئەویـنـداران نـیم ئەگەر هـاتوو دڵـم نەکـردە شـوێن و مـاڵ و پـێگەیەک بـۆ ئەو {خـودا} ، ســوڕانەوەی بە دەوری دڵ بێــت و هەر ئەوێــش شــوێنی ســەلامکردنم بێــت کاتێــک دەسوڕێمەوە بە دەوری**

## شیعری سی و نۆ : یا أیها السید الکریم

یا أيُّها السيدُ الكريمُ

حبُّك في الحَشا مُقيمُ

یا دافعَ النوم عن عیوني

أنت بما مَرَّ بي علیم

**گەورەم ئەی بەخشـــندە ، خۆشەویســـتی تـــۆ لە هەنـــاو و دڵـــم نیشـــتەجێیە ، ئەی ئەو کەسەی خەوت لە چاوەکانم نەهێشتووە ، ئەوەی بەسەرمدا دێت تۆ ئاگاداریت پێی**

## شيعری چل : قالوا جننت على ليلى فقلت لهم

قالوا جُنِنتَ على ليلى فقلت لهم

الحب أيسَرُهُ ما بالمجانين

**وتيـان : لەپێنـاو لەيـلادا شـێت و شـەيدا بويـت ؟ ، وتـم : خۆشەويسـتی هەرە کەمەکەی ئەوەيە کە بەسەر شێتەکان دێت**

**شیعری چل و یەک : أن المحبين أحياء و إن دفنوا**

إنَّ المحبين أحياءٌ وإن دُفِنوا

في التُربِ أو غُرِّقوا في الماءِ أو حُرِقوا

أو يقتلوا بسيوف وسط معركة

أو حَتفَ أنفٍ وإن أضناهم الفَرقُ

لو يسمعون منادي الحب صاح بهم

يوما لَلَبَّاهُ من بالحب يحترق

**ئەویندارانی زیندوون ئەگەر بشنێزرێن لە خاکدا یاخود بخنکێن لە ئاودا یاخود بسوتێنرێن یاخود بکوژرێن بە شمشێر لەناو شەڕدا یاخود بمرن یان لاشەیان پارچە پارچە بکرێت {لێرەدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ حەزرەتی شیبلی ئاماژە بۆ حەزرەتی حەلاج (کە ئەویندارێ ڕاستەقینەی خودا بوو) دەکات کە قامچی لێ درا و پاشان بۆ ڕۆژێک هێڵدرایەوە خوێنی لێ بچۆڕێت و پاشان لە خاچیان دا و دەست و قاچەکانیان بڕی و پاشان سەری ، دواتریش جەستەیان سوتاند و خۆڵی جەستەکەیان فڕێ دایە ناو ڕووباری دیجلە و پارچەکانی تری جەستەی هەڵواسران بەسەر پردێک**

**تــا خەڵــک ببینێــت} ، ئەگەر گوێیــان لێبێــت ڕۆژێــک کە بــانگەواز بــۆ ئەوینــدارانی خۆشەویســـتی بکـــات لەنێوانیانـــدا ، ئەوا هەمـــوو ئەوانەی بە خۆشەویســـتی و ئەویـــن دەسوتێن بەدەم ئەو بانگەوازەوە دەچن**

## شیعری چل و دوو : إذا خاطبوني بعلم الورق

إذا خاطَبوني بعلمِ الوَرَق

بَرزَتُ عليهم بعلمِ الخِرَق

**ئەگەر ئەوان بە زانستی کاغەزەکان قسەم لەگەڵدا بکەن ، ئەوا من بە زانستی خودایی (زانستی تەصەوف) قسەیان لەگەڵ دەکەم**

## شیعری چل و سێ : فلو أن لي في كل يوم و ليلة

فلو أنَّ لي في كل يوم وليلة

ثمانين بحراً من دموعِ تدفَّق

لافنيتُها حتى ابتدأتُ بغيرها

وهذا قليل للفتى حين يعشق

أهيم به حتى المماتِ لِشقوتي

وحولي من الحُبِّ المُبَرِّحِ خندق

وفوقي سَحابٌ تُمطر الشوق والهوى

وتحتي عيون للهوى تتدفق

**ئەگەر لە هەمـــوو شـــەو و ڕۆژێكـــدا هەشـــتا دەریـــا لە فرمێســـك لە چـــاوم بێـــت ، ئەوا هەمـــووی تەواو دەكەم و دەســـت دەكەم بە ڕشـــتنی فرمێســـكی زیـــاتر ، ئەمەش كەمە بـــۆ كەســـێك كە ئەوینـــدار بێـــت ، مـــن ئەوینـــداری ئەوم هەتـــاكو مـــردنیش ، لە دەروبەریشـــم خۆشەویســـتی بەشـــێوەیەك هەیە كە لە خەنـــدەق دەچێـــت ، لە سەرەوەشـــمدا هەورێـــك**

**هەیە کە حەز و خۆشەویستی و ئەویننداری دەڕژێنێت و لە خوارەوەشمدا چاوێک هەیە کە بەم خۆشەویستیە فرمێسک دەڕێژێت {لێرەدا حەزرەتی شیبلی دەیەوێت وەها بیشوبهێنێت کە خۆشەویستی هەورێکە و باران دەبارێنێت بەسەر چاوەکانی ئەم دا و چاوی ئەمیش وەک خەندەقێکە کە ئەو فرمێسک و بارانەی تێ دەڕوات}**

## شیعری چل و چوار : لیس تخلو جوارحي منک وقتا

لیس تخلو جوارحي منك وقتاً

هي مشغولة بِحَملِ هواكا

لیس یجري على لساني شيء

عَلِمَ الله ذا سوى ذِكراكا

وتمثَّلتَ حین كنتَ بعیني

فهي إن غبتَ أو حضرت تَراك

ئەنــدامەکانی جەســتەم لە تــۆ خــاڵی نەبــووە هەرگیــز ، بەڵکــو ســەرقاڵە بە هەڵگرتنــی ئەوینــداری تــۆ ، لە زمانیشــم هــیچ شــتێک کە خــوا بیزانێــت نــایەت جــگە لە یــادی تــۆ ، کــاتێکیش تــۆ لەنــاو چاوەکــانم بویــت وام لێهــات تەنهــا تــۆم دەبینــی کاتێــک دێیــت و دەڕۆیت

## شیعری چل و پێنج : یا موضع الناظر من ناظري

يا موضعَ الناظرِ من ناظري ويامكان السر من خاطري

يا جملة الكُلِّ التي كُلُّها أحبُ من بعضي ومن سائري

تُراكَ ترثي للذي قَلبُهُ مُعَلَّقٌ في مِخلَبَي طائر

مولّه حيرانُ مستوحش يَهرَبُ من قفرِ إلى آخر

يسري وما يَدري وأسرارُهُ تسري كلمحِ البارقِ النائرِ

في لُجِّ بحرِ الفكرِ تجري به لطائِفٌ مِن قُدرةِ القادر

**ئەوی ئەو کەسەی پێگەی تێڕوانەرت هەیە لە تێڕوانینمدا و شوێنی نهێنیەکان تۆیت لە هەناومدا ، ئەی هەموو شتێکم کە لە بەشێکی جەستەم {دڵ} و هەموو جەستەم زیاتر خۆشم دەوێیت ، وا دەبینرێیت بەزەییت بە دڵێک بێتەوە کە وەک ئەوە وایە گیر بوبێت لە چنگی باڵندەیەک ، کەسێک کە سەرگەردان و سەرلێشێواو و تینوو بۆ دیدارە و لە شوینێکەوە دەچێت بۆ شوێنێکی تر ، دەڕوات و بێهۆشە و نهێنیەکانی وەک هەورەبروسکەی ڕۆشنا بەناو دەریای هزر و بیرکردنەوەیدا بەزەیی و بەخشندەیی خودای دەسەڵاتداری پێ تێدەپەڕێت**

## شیعری چل و شەش : أقلل ما بي فيک و هو كثير

أُقَلِّلُ ما بِي فيك وهو كثير

وأجُر دمعي فيك وهو غزير

وعندي دموع لو بَكَيتُ ببعضها

لفاضَت بُحورٌ بعدهن بحور

قُبورُ الورى تحت التراب وللهوى

رجال لهم تحت الثياب قبور

سأبكي بأجفان عليك قَريحة

وأرنو بألحاظِ إِليك تُشير

ئەوەی توشــم بــووە لەپێناوتــدا بە کەمــی دادەنــێم لەکاتێکــدا زۆرە ، فرمێســک لە پێنــاوت دادەبــارێنم وەک بــارانی بەخــوڕ ، جــۆرە فرمێسـکێکم هەیە کە ئەگەر بیــڕژم دەریـا لە دوای دەریـا دروسـت دەکـات ، گـۆڕی خەڵـک لە ژێـر خەڵکە ، ئەوینـدارانیش

**پیاوانێکیـان تیـایە کە نـاو پۆشـاکەکەی بەریـان بـۆتە گـۆڕ ، فرمێسـکێکی زۆرت بە چـاوانم بۆ دەڕژێنم و دەناڵێنم و دەگریم بە شێوەیەک کە ڕەفتارەکانم ئاماژە بین بۆتۆ**

## شیعری چل و حەوت : لما بدا طالعا غابت لهیبته

لَمّا بدا طالعاً غابت لهيبته

شمسُ النهار ولم يطلُعُ لنا قَمَرُ

**کاتێـــک دەرکەوت لە تـــاو دەرکەوتنیـــدا خـــۆری ڕۆژگـــار لاچـــوو و مانـــک نەیتـــوانی دەرکەوێت**

## شیعری چل و هەشت : وتحسبني حيا و إني لميت

وتحسَبُني حياً وإنّي لميِّتٌ

وبعضي من الهِجران يبكي على بعض

**وای دادەنێیـت مـن زینـدوو بـم لەکاتێکـدا مـن مـردووم و لەتـاو دووری ئەودا بەشـێکم بەسەر بەشەکەی ترمدا دەگری**

## شیعری چل و نۆ : جننا علی لیلی و جنت بغیرنا

جُنِنّا على ليلى وجُنَّت بغيرنا

وأخرى بنا مجنونةٌ لا نُريدها

شـێت بـوین و هۆشـمان لەدەسـت دا لە پێنـاو لەیـلا ، کەچـی ئەویـش بـۆ کەسـێکی تـر جگە لە ئێما شێت بوو ، کەسانێکیش بۆ ئێمە شێت بوون کە ئێمە ئەوانمان ناوێ

## شیعری پەنجا : مضى زمن و الناس يستشفعون بي

مضى زمن والناسُ يستشفعون بِي

فهل لي إِلى ليلى الغداةَ شفيعُ

کات و سەردەمانێک تێپەڕی کەوا خەڵک من دەکەنە نێوەندگیر و لەڕێی منەوە دەگەنە مەبەستەکەیان ، ئایا لە ڕۆژی دواییدا منیش کەسێک هەیە نێوەندگیر بێت بۆم و لەڕێی ئەوەوە من بگەیەنێت بە لەیلا

# پێڕست

